٢٠١٧

# تەنها تۆم لە دڵە



هەندێ لە وتەکانی

مەهدی سێرڤەر

# هەندێ لە وتە و شعرەکانی مەهدی سێرڤەر

ناوی کتێب : تەنها تۆم لە دڵە

بابەت : ووتە و شعر

نووسەر : مەهدی سێرڤەر


فەیس بووک : Mahdi Gyan

پەیج : مەهدی سێرڤەر

لینکی فەیس بووک :

http://www.facebook.com/mahdi.server

لینکی پەیج :

http://www.facebook.com/mahdi.server.officail

انستاگرام : mahdi_gyan

ئەبوو هەینی پشوو بایە
کفرە حەوت ڕۆژ تەنیایی

**************

ئێمەی پیاو
کە دڵ تەنگ ئەبین
سکاڵامان لە یار هەیە
بەس نایکەین



لە تەواوی ئافرەت بێ منەتم
بەس تۆ لەگەڵمبە و
پشتم بەرمەدە ..
*************
سەیرم بکە
با منیش هەست بکەم
کەسێکم هەیە..



زۆر کەس
پێم ئەڵێن مات و کز بووی
چ بڵێم پێیان ئازیز
کە هیچیان باوەڕ ناکەن
تۆ هۆکاری ..

**************

هیچ وشەیێ نیە
هێندەی وشەی بیرت ئەکەم
زیاتر دڵخۆشم بکا ..



وردە وردە
سارد ئەبێ ، کەش نا
نیگای یار..
**********

خۆشم دەوێی
هەرچەن کە شایەنیش نیت..



به قسه ڕەقەکانی
دڵ شکاو زمانیش لاڵ ..

***********

دڵ ماندووه
لەهەموو ئەو زوڵمانەی
یار لێی دەکا..



توانام هەبا
ڕێگام لەهەموو مەخلوق ئەگرت
ئاشق نەبن ..
*************
تاوان بارم
قەدری دڵی خۆم نەزانی
ئەو ژیانی پێدام
بەڵام من
بەرگریم لێ نەکرد
کە ئەیان شکاند ..

مەهدی سێرڤەر
وتەکانی

بێ مەیل مەبە
ڕۆژێ دێ
بێ مەیلیم ئەتخنکێنێت..
*******
بۆ بێگانە فڕێم مەدە
ڕۆژێ دێ
هەموو سووچی کۆڵانەکان
بۆم ئەگەڕێیت
نامدۆزیەوە !



باش نیم
بەڵام تۆ پێم بڵێی چۆنی
باش ئەبم . .
************
وای چ غەدرە
بۆت بنووسم بیرت دەکەم
لە کاتێکدا
هیچ لەبیرمدا نیت ..



مەڵێ قەدەرمان بۆ یەک نیە
ڕونتر بڵێ ئازیز
بڵێ ژیان لەگەڵ ئەو خۆشترە..
*************
ژین خۆشی واتا
لەتەک تۆ بم و بڵێی
"خۆشم دەوێی"



کە بە نیگا ئاشق بووی
شتێ نیە بەناوی
“جیابوونەوە”
*************
تۆ
ئەو خەیاڵەی
لەبیری هیچ کەس دا نیت
من نەبێ..



ئەمڕۆ چوومە بەر ئاوێنەکە
لە چاوەکانم پرسی
سکاڵا لەو نیە
کە هەموو شەو ئەتگریەنێ ؟
*************
ئەو لێوانەی کە مژیومن
چۆن ئەتوانن بە خراپە
باسم بکەن؟



له بێ تۆیدا
خەریکە ئاشقی تەنیایی ئەبم..
************
من باشم
خەمی منت نەبێ
تەنیایی باش ئاگای لێمە..



وەک تەختەی تەڕ وابە
بە قسەی هەموو کچێ
گڕ مەگرە !
************
من نووسەر نیم
چوون ناتوانم بە نووسینەکانم
قەناعەتت پێ بکەم
خۆشم دەوێی



زۆر دەمێکە ڕۆشتوە
دەمێکە چاوەڕێی گەڕانەوەیم
ئەو نا
ڕەنگ و ڕووی جارانم..
*********
نەهاتەوە
تاقەتم چوو لە تەنیایی..



سێرکەن
دڵمی ورد و خاش کردووە
ئێستاش بە یار
بانگی ئەکەم !

*********

مزگێنی بەنە دایکی یار
بڵێن کچەکەی فریشتەیە



بپرسن
دڵی یار لە چ توخمێکە
وا ڕەقە ؟
**********

دەستت لەناو دەستم
من بە حەجێک ئەیبینم ..



ئەمڕۆ
هیچم نیە  بۆی
تەنها خراپ بیری ئەکەم..
**********
وا ئەزانێ کە لێم دوورە
وا ئەزانم دڵخۆشە
نازانێ کە من دەزانم
لە من دوور بێ نەخۆشە..



”هەوڵمدا ، نەمتوانی“
بەس یار
لەم دوو وشە تێ ئەگا
هیچ کەسی تر نا
هیچ کەس..

***************

دڵ
ئاوەدانە
کە تۆی تیا نیشتەجێی..



ببینێ یا نەبینێ
من بەنیگا سەیری ئەکەم
ببیستێ یا نەبیستێ
من بە دڵ بانگی ئەکەم

***************

من
لە ئەستێرەکان
هەواڵی تۆم لایە
ئەی تۆ
هەواڵم ئەزانی..



من
پێوانەم کردوە
تەنیا ئەو شەوانەی
تۆ پێم ئەڵێی شەوشاد
شەوم شادە

***************

بە بیرتا دێت
دڵ چەند تەنگە؟



وەرە تەکم دانیشە
گەرەکمە ئەمشەو
هەموو دڵتەنگیەکانمت
بە شعر بۆ بنووسمەوە..

***************

دڵم ڕامەگرە
بەس مەشێ شکێنە..



وتیان
ئەو دەرمانە ئازار شکێنە
ناوی چیە؟
پێی چاک ئەبی
وتم ئەو..

***************

لە کوێیە
لای کێیە
چی ئەکا
نازانم
بەس ئەوەندە ئەزانم
ئەویش بیرم ئەکا



دڵتەنگی
منی کردۆتە چاکەت
هەمیشە ئەمپۆسێ..

***************

تەنیاترین تەنیام
هەموو خەتای نەبونتە..



ئەو خەمووە ئازارەی
پێمی ئەدەی لە هەبونت
زۆر باشترە لە نەبونت..

***************

لامبە
من نامەوێ
دڵ ئەیەوێ دڵ..



هەر من نیم
بە ڕۆشتنت دڵ تەنگ ئەبم
کە تۆ دەڕۆی
ئەستێرەکانیش دڵگران ئەبن و
ون ئەبن..

***************

کە باسی
لەبیرکردنی ئەکرێ
چۆکم ئەشکێ !

مەهدی سێرڤەر
وتەکانی

ناوی من
لە دەمی تۆ
”ئاڵتوونە“

***************

ئەزانی
کەتۆ لێرە نیت
چی ئەکەم؟
تاکە ئیشی من
بیرکردنتە..



چ شەوێکی غەمگینە
دڵ تەنگ تەنگە
پێی بڵێن
بیری ئەکەم

***************

ئەمەوێ
نازناوێکت بۆ دانێم
"خۆشم دەوێی"
پێت چۆنە؟



هیچ هونەرێ نابینم
له هاتن
ئەمما مەیلی نیە بێت

***************

تۆ
نەک قسەکانت
نیگاکانیشت
درۆن..



**هێندەی دایکت**
**خۆشت بوێم**
**ئیدی لەم دنیایە بەسمە..**

***************

**هیچ بیرم لانیە**
**لە لەبیر کردنت..**



ئەمەوێ
سنووری خۆشەویستیت
بە هەمووکەس بڵێم
بۆ ئەوەی کەس
لەو سنووره لانەدا

***************

من
تەواوی تۆ
بە هی خۆم ئەزانم



بەختی من
هێندەی چاوەکانت ڕەشە..

***************

بێزاربووم
لەشعر نوسین
وەلی هەر تێنەگەشت
چەنم خۆشەوێ



به نهێنی خۆشم ویست
وای زانی لەبیرم کردوە
***************
کەسانێ هەن
تەنیا لەکاتی تەنیا بوونت
تۆیان دەوێ..



ساردیەکەی تۆ
بەشێوەیەک ساردە
زستان خۆی لەبەر ناگرێ

***************

نەخۆشم
بەدوعای یار نەبێ
چاک نابم..



ئێمە نا
ئەوان خۆشەویستی
ئێمەن

***************

هەنێ کەس
کە هیچیان دەست ناکەوێ
بۆ ئەوەی جێت بهێڵن
تاوان بارت ئەکەن..



بەرامبەرم
دانیشتبوو
چاوەکانی وتیان
"خۆشم ئەوێی"

***************

تۆ
خوات لەبیرکردوە
چۆن من لەبیر ناکەی !



هەموو شتێکم لەدەستدا
بۆ بەدەست هێنانت..

***************

ئازیز
ئێمە لای یەکەوە جوانین
جیابونەوەمان لێ نایە..



مەهێڵە کەس

شانازیت پێوە بکا

جگە لەخۆم

تۆ جێی شانازیت بۆم..

***********

وای بۆ ئەو ڕۆژەی

ئەو بێدەنگیەت ئەشکێنم

جا بە مەرگ بێت یان بە دوری..



کەسێ هەیە
هەمیشە و
چرکە بە چرکە
لە خەیاڵمە..

***************

دڵ
یەک جار ئەشکێ
خۆڵەمێشیش
جارێکی تر ناسوتێ..



ئەڕۆن و لەبیرت ئەکەن
دوای پێت ئەڵێن
خیانەت کار

***************

گرنگی
بە کەسە ساردەکان مەدەن
ئەوان هەمیشە گەرم ئەکرێنەوە



ئەوانەی دڵ ئەشکێنن
تەنها ئەوانەن
کە پێشتر دڵخۆشت کردون

****************

دڵ دەشکێن و ئەڕۆن
ئەوە پیشەو کاری هەمیشەییانە..



هەرکات بێکەس بوو
تۆی هەموو کەسە..

***************

کەسم
بۆ کات بەسەربردن ناوێ
کات خۆی ئەڕوا
ئەگەر بمەوێ
بۆ هەمیشە ئەمەوێ



مەڵێ بیرت ئەکەم
بڵێ وا ڕوحم ئەکێشن..

***************

لەبیرم کرد
بوو بە بێگانە لام
بەڵام کە جارێک بینیم
دوبارە ئاشقی بومەوە..



وتیان
بۆوا بێدەنگی
بۆوا دڵتەنگی
بۆوا شکاویت
وتم سادەم سادە

***************

مێشک و دڵ
هەردووک بریار ئەدەن
بەڵام بڕیارەکانی
دڵ
ئیجباریە..



خۆت
خۆم تەرک بکە
من
بۆم تەرک ناکرێی..
***************
ئاشقتم
بە بوون و نەبوونتەوە..



بەرامبەرم
دانیشتبوو
چاوەکانی وتیان
"خۆشم ئەوێی"

***************

یارم نەبوو
تا یاری بم..



دەردە دڵیم
لای تەنیایی کرد
خەڵکی وتیان
شێت بووە..

***************

لەگەڵ تۆ بوون
زۆر مانای هەیە
یەکێکیان ژیانە..



مەهێڵە برۆم
تکام لێبکە بمێنمەوە
ئاخر ئەزانم
دوای من
بێ سۆراغ ئەمێنیتەوە..
****************
دڵم ڕامەگرە
بەس مەشی شکێنە..



زۆر بەوەفا بووین
ئیتر ئەبێ بێوەفا بین..

***************

لەبیرم کرد
بوو بە بێگانە لام
بەڵام کە جارێک بینیم
دوبارە ئاشقی بومەوە..



له ئەشقدا
شەرم نیە
ئەوەی شەرم بكا
ئاشق نیە

***************

بێ شک و دڵنیابن
لای هەر کەس بێ
من بە یاری خۆی
ئەزانێ..



سەیرم کرد
تەنیایی
لە خوا جوانبوو
وامزانی لە منیش جوان ئەبێ..

***************

چاوەڕێ نیم
لەم بێ کەسیە
کەسێ بێت و
دوبارە بمشکێنێ..



کفره
تۆم هەبیت و
بیرم لای تەنیایی بێت ..

***************

وای چ خۆشە
لێوەکانم
بئاڵێ لە دەم و لێوت
چەندە خۆشە تێر بۆنیکەم
تاڵ تاڵی زوڵفی پەشێوت ..



زۆر دەمێکە
چاوەڕێی ئەو وشەیەم
لە دەمت بغزێ
قەینا بە درۆش بێت
یەکجار بڵێ
" خۆشم دەوێی "

***************

گەر تۆ خۆت نەکەیتە خاوەنم
ئیدی من موڵکی کەس نیم



PDF 4 KURD

بیرت دەکەم
ڕەنگە تەنها
وشەیەک بێت لای تۆ
بەس باوەڕ بکە
"بیرت دەکەم"
دەمەوێ بتبینم
دەمەوێ لە باوەشت بکەم و
تێر بۆنت بکەم
دەمەوێ سەیری چاوەکانت بکەم
هەرچی ئەو قسانەی بە چاو ئەکرێن
پێتی بڵێم
بۆ نمونە : ئاشقتم ..



تۆ بە خۆت و  بەوانەوە
گرنگ نیە چەند کەسی
منت نەبێ ،
لە عالەمدا بێ کەسی ..
***************
فێری پێکەنینم بکە
گریان ڕەفتاری سکماگیمە ..



پێم پێکەنین
شکاندمیانەوە
کاتێ وتم :
تاڵە قژێکی تۆ
بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە ..

***************

کە ئەڵێم باشم
وا نیە درۆ ئەکەم
باوەڕ بکەن
نە شەوەکانم شادن
نە بەیانیەکانیشم
باشن ..



که وتیان هی کێیت
بڵێ ئەو
خۆیان ئەزانن من کێم..

***************

دڵ عادەتی بەوە گرتوە
خۆشی بوێی
تەنانەت گەر لێرەش نیت
لەبەر خۆیەوە ئەڵێت
قوربانت بم



ئازیزەکەم بیرت دەکەم
بیری ژیانەکەی جارانمان
بیری ئەو کاتانە ئەکەم
ئاوێتە دەبوون دەستانمان
بیرت دێ کە جاران ئێمە
چەن چاک و باش بوو نێوانمان
هەزار خۆزگە بەو ساتەکات
کە تێکەڵ ئەبوون لێوانمان..



لێم ببورە
لە باوەشم نەگرتبیت
لێم خۆشبە
گەر بۆ بۆنەکەم مردبیت
:
لێم ببورە
کە تێر سەیرم نەکردبیت
لەو دەرفەتانەش ببورە
کە تێر بۆنم نەکردبیت
:
لێم ببورە
کە ئیتر سەیرم نەکردیت
لێم زیز لەبە
کە ماچی گۆنام نەکردیت
:
لێم ببورە
کە ئیتر ناوتم نەهێنا
من ببەخشە
کۆتایم بە ئەشقت هێنا..



هەموو شەوێ
سەرێک لای ماڵ ئێوە ئەدەم
تەپەی پێ دێ
دەبێ کێ بێ ؟
:
دەبێ کێ بێ
بەو درەنگە وا بێدارە
لە دوری یار وا بێزارە
:
ناهەق ناگرم گەر بۆتۆش بێ
چونکە وا نەرم و نیانی
خۆ گەر جوانی مانگ نەبوایە
تۆ ئەبویتە یەکەم جوانی
:
لەراستیدا لەمانگ ئەچی
لای منەوە دایمە جوانی
تاکە جیاوازیت ئەوەیە
بە ڕۆژ بۆ من و شەو بۆ ئاسمانی



بەشانازی باسی ئەکەم
ئەو کچەی وا لە دڵمایە
درۆ نیە ئەگەر بڵێم
جوانترین کچی دنیایە
:
ڕەنگە زۆر کەس لەم دنیایە
جوانتر هەبێ
بەڵام لەناو هەموویانا
دڵم تەنیا ئەوە ئەوێ
:
لە خەودابێ
چەندە خۆشە یار ماچ کردن
ڕێچکەی منە لەگەڵ ئەودا
فرە خۆشی ژیان کردن



هەرتۆ نەبووی کەپێت وتم
بڕۆ وازم لێ بهێنە
تۆ نەبوی کەبە چرکەیەک
کۆتایت بە ئەشقم هێنا
کەوایە هەرگیز جارێتر
بە گاڵتەش ناوم مەهێنە..



## سوپاس بۆ هەڵبژاردنی ئەم کتێبە




## بۆ دەست کەوتنی ئەم کتێبە
## سەردانی ئەم ئەدرەسانە بکەن

Facebook : Mahdi Gyan
Link : http://www.facebook.com/mahdi.server
Page : مەهدی سێرڤەر
Link : http://www.facebook.com/mahdi.server.officail
instagram : mahdi_gyan

